**بسم الله الرحمن الرحيم**

إِنَّ الْحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِيْنُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوْذُ بِاللهِ مِنْ شُرُوْرِ أَنْفُسِنَا وَسَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيْكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُوْلُهُ.

اَللهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ عَلى مُحَمّدٍ وَعَلى آلِهِ وأَصْحَابِهِ وَمَنْ تَبِعَهُمْ بِإِحْسَانٍ إِلَى يَوْمِ الدِّيْن.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢ ﴾ آل عمران: ١٠٢

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ ﴾ النساء: ١

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١ ﴾ الأحزاب: ٧٠ - ٧١

اما بعد...

هەروەکو خودای گەورە لە قورئانی پیرۆز دەفەرمووێت: ﴿ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ٢٢ ﴾ القمر: ٢٢ بێگومان ئێمە قورئانمان ئاسان کردووە بۆ (خوێندنەوە و تێگەیشتن) و ئامۆژگاری وەرگرتن، جا ئایا کەسێک هەیە هەست بەم حەقیقەت و ڕاستییە بکات و پەندی لێ وەرگرتبێت؟

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ((إِنَّ لِلَّهِ أَهْلِينَ مِنْ النَّاسِ)) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَنْ هُمْ؟ قَالَ: ((هُمْ أَهْلُ الْقُرْآنِ، أَهْلُ اللَّهِ وَخَاصَّتُهُ))[1]

---

[1]- وصححه الألباني في "صحيح ابن ماجة"

# ڕاڤەی سووڕەتی (الملك)

واتە: ((ئەنسی کوری مالیک دەگێرێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بێگومان خودا کەسانێکی تایبەتی هەن لە نێو خەڵک. گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە کێن؟ فەرمووی: ئەوانەی هۆگرانی قورئانانن، ئەوانە کەسانی تایبەتی خوان).

ئـێمە لەژێر ڕۆشنایی ئەم ئایــەت و فەرموودانە هەوڵماندا کارێک ئەنجام بدەین لەپــێناو خودا هەڵساین بە ئەنجام دانی پرۆژەی لەبەرکردن و ڕاڤەی سووڕەتی (الملك).

لە ئەبو هورەیرەوە -خودا لێی ڕازی بێت- لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەفەرموێت: ((إنَّ سورةً في القرآنِ ثلاثونَ آيةً؛ شَفَعَتْ لِرَجُلٍ حتى غُفِرَ له، وهي: ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ﴾)).

واتە: ((سووڕەتێک هەیە لە قوڕئانی پیرۆز سی ئایەتە، شەفاعەت بۆ خاوەنەکەی (ئەوکەسەی دەیخوێنێت) دەکات تاکو خودا لێی خۆش دەبێت، ئەویش سووڕەتی ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ﴾ ـە)).

هەروەها لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە سووڕەتی تەبارەکە ڕێگری دەکات لە سزای ناو گۆڕ بۆ ئەو کەسەی شەوانە بیخوێنێت.

عبدللە ی کوڕی مەسعود دەفەرمووێت: لەسەر دەمی پێغەمبەر ﷺ ناومان لە سووڕەتی مولک نابوو سووڕەتی (المانعة).

حەمد و سەنا بۆ خوای بەرز و بڵند کە بە پشــتیوانی خوا، ئینجا پشتیوانی ئەندامانی «ڕۆشــنایی قورئان» توانیمان ئەم پرۆژەیە بە بەرهەم بگەیێنین.

واللە ولي التوفيق

# ڕاڤەی سووڕەتی (الملك)

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ (١) ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفُورُ
(٢) ٱلَّذِي خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ طِبَاقٗاۖ مَّا تَرَىٰ فِي خَلۡقِ ٱلرَّحۡمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٖۖ فَٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ هَلۡ تَرَىٰ مِن فُطُورٖ (٣) ثُمَّ ٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ
كَرَّتَيۡنِ يَنقَلِبۡ إِلَيۡكَ ٱلۡبَصَرُ خَاسِئٗا وَهُوَ حَسِيرٞ (٤) وَلَقَدۡ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلۡنَٰهَا رُجُومٗا لِّلشَّيَٰطِينِۖ وَأَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ
عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ (٥) وَلِلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ عَذَابُ جَهَنَّمَۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ (٦) إِذَآ أُلۡقُواْ فِيهَا سَمِعُواْ لَهَا شَهِيقٗا وَهِيَ تَفُورُ (٧) تَكَادُ
تَمَيَّزُ مِنَ ٱلۡغَيۡظِۖ كُلَّمَآ أُلۡقِيَ فِيهَا فَوۡجٞ سَأَلَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَذِيرٞ (٨) قَالُواْ بَلَىٰ قَدۡ جَآءَنَا نَذِيرٞ فَكَذَّبۡنَا وَقُلۡنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٍ
إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ كَبِيرٖ (٩) وَقَالُواْ لَوۡ كُنَّا نَسۡمَعُ أَوۡ نَعۡقِلُ مَا كُنَّا فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ (١٠) فَٱعۡتَرَفُواْ بِذَنۢبِهِمۡ فَسُحۡقٗا لِّأَصۡحَٰبِ
ٱلسَّعِيرِ (١١) إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ (١٢) وَأَسِرُّواْ قَوۡلَكُمۡ أَوِ ٱجۡهَرُواْ بِهِۦٓۖ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ
ٱلصُّدُورِ (١٣) أَلَا يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ (١٤) هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ ذَلُولٗا فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦۖ
وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ (١٥) ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ (١٦) أَمۡ أَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ
حَاصِبٗاۖ فَسَتَعۡلَمُونَ كَيۡفَ نَذِيرِ (١٧) وَلَقَدۡ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ (١٨) أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلطَّيۡرِ فَوۡقَهُمۡ صَٰٓفَّٰتٖ
وَيَقۡبِضۡنَۚ مَا يُمۡسِكُهُنَّ إِلَّا ٱلرَّحۡمَٰنُۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءِۭ بَصِيرٌ (١٩) أَمَّنۡ هَٰذَا ٱلَّذِي هُوَ جُندٞ لَّكُمۡ يَنصُرُكُم مِّن دُونِ ٱلرَّحۡمَٰنِۚ إِنِ ٱلۡكَٰفِرُونَ
إِلَّا فِي غُرُورٍ (٢٠) أَمَّنۡ هَٰذَا ٱلَّذِي يَرۡزُقُكُمۡ إِنۡ أَمۡسَكَ رِزۡقَهُۥۚ بَل لَّجُّواْ فِي عُتُوّٖ وَنُفُورٍ (٢١) أَفَمَن يَمۡشِي مُكِبًّا عَلَىٰ وَجۡهِهِۦٓ أَهۡدَىٰٓ أَمَّن
يَمۡشِي سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ (٢٢) قُلۡ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُمۡ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَۖ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ (٢٣) قُلۡ هُوَ ٱلَّذِي
ذَرَأَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَإِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ (٢٤) وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ (٢٥) قُلۡ إِنَّمَا ٱلۡعِلۡمُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٞ مُّبِينٞ

# ڕاڤەی سوورەتی (الملك)



﴿٢٦﴾ فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً سِيٓـَٔتْ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَقِيلَ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تَدَّعُونَ ﴿٢٧﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَهْلَكَنِىَ ٱللَّهُ وَمَن
مَّعِىَ أَوْ رَحِمَنَا فَمَن يُجِيرُ ٱلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٨﴾ قُلْ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ءَامَنَّا بِهِۦ وَعَلَيْهِ تَوَكَّلْنَا ۖ فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ فِى ضَلَٰلٍ
مُّبِينٍ ﴿٢٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَآؤُكُمْ غَوْرًا فَمَن يَأْتِيكُم بِمَآءٍ مَّعِينٍۭ ﴿٣٠﴾ ﴾



# ڕاڤەی سووڕەتی (الملك)



بسم الله الرحمن الرحيم



﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ١﴾

گەورە و موبارەک و پیرۆزە، ئەو زاتەی کە هەموو بوونەوەر و جیهانی بەدەستە، ئەو زاتەی دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفُورُ ٢﴾

هەر ئەو خۆی مردن و ژیانی بەدیهێناوە، تا تاقیتان بکاتەوە، کێتان کردەوەی چاکتر و پەسەندترە، هەر ئەویش زاتێکی باڵادەستە بەسەر بێ باوەڕاندا، وە لێخۆشبووە لە ئیماندا ران.



# ڕاڤەی سوورەتی (الملك)

﴿ٱلَّذِي خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ طِبَاقٗاۖ مَّا تَرَىٰ فِي خَلۡقِ ٱلرَّحۡمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٖۖ فَٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ هَلۡ تَرَىٰ مِن فُطُورٖ


٣﴾

هەروەها ئەو زاتە ئاسمانەکانی بە حەوت چین دروست کردووە، لە نێو بەدیهێنراوەکانی ئەو خوای میهرەبانە هیچ ناڕێکی و ناتەواویەک بەدی ناکەیت، ئەی ئینسان: هەرچاو بگێڕەو سەرنج بدە بزانە هیچ درز و کەم و کوڕیەک بەدی دەکەیت؟

﴿ثُمَّ ٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ كَرَّتَيۡنِ يَنقَلِبۡ إِلَيۡكَ ٱلۡبَصَرُ خَاسِئٗا وَهُوَ حَسِيرٞ ٤﴾

پاشان هەر سەرنج بدە و چاو بگێرە و ورد بەرەوە، جار لە دوای جار و کۆڵ مەدە، سەرسام و ملکەچ دەبیت، چاوت بە نائومێدی دەگەڕێتەوە، لەکاتێکدا کە چاوت ماندووە و پەکی کەوتووە.



﴿وَلَقَدۡ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلۡنَٰهَا رُجُومٗا
لِّلشَّيَٰطِينِۖ وَأَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ ٥﴾



سوێند بەخوا بێگومان ئێمە ئاسمانی دنیامان کردووە بە چراخان، (بەهۆی ئەستێرەکانەوە کە بە شەوگاردا بەدی دەکرێن) و بەو ئەستێرانە شەیتانەکان ڕاو دەکەین، لە قیامەتیشدا سزاو ئەشکەنجەی دۆزەخمان بۆ ئامادە کردوون.

﴿وَلِلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ عَذَابُ جَهَنَّمَۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ
٦﴾



هەروەها بۆ ئەوانەش کە باوەڕیان بە پەروەردگاریان نییە، سزا و ئازاری دۆزەخ ئامادەیە، ئای کە چارەنووس و سەرئەنجامێکی زۆر ناسۆر و ناخۆشە.

﴿ إِذَآ أُلۡقُواْ فِيهَا سَمِعُواْ لَهَا شَهِيقٗا وَهِيَ تَفُورُ ٧ ﴾



کاتێک فڕێ دەدرێنە ناوی دەنگێکی ناساز و ناخۆش و لوورەیەک لە دۆزەخەوە دەبیستن، لەکاتێکدا قوڵپ دەدات و دەکوڵێت.

﴿ تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلۡغَيۡظِۖ كُلَّمَآ أُلۡقِيَ فِيهَا فَوۡجٞ سَأَلَهُمۡ
خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَذِيرٞ ٨ ﴾



لە داخی خوانەناسان خەریکە پارچە پارچە ببێت و لێک ببێتەوە، هەر جارێک دەستە و تاقمێک فڕێ دەدرێتە ناوی پاسەوانی دۆزەخ لێیان دەپرسێت: باشە، ترسێنەرێکتان بۆ نەهات تا لەم سەرئەنجامە ئاگادارتان بکات؟!.



9 ﴿ قَالُوا۟ بَلَىٰ قَدْ جَآءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِى ضَلَـٰلٍ كَبِيرٍ ﴿٩﴾ ﴾

لە وەڵامدا بەکەساسییەوە دەڵێن: با، بەڵێ، لەڕاستیدا ترسێنەرمان بۆهات، بەڵام ئێمە بڕوامان پێنەکردن و وتمان: خوا هیچی لەم بارەیەوە نەناردووە، ئێوە تەنیا لە گومڕایی گەورەدا گیرتان خواردووە و هیچی تر!.

﴿ وَقَالُوا۟ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَـٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٠﴾ ﴾

ئینجا دەڵێن: ئەگەر ئێمە گوێمان بگرتایە وبیرو هۆشمان بەکار بهێنایە نەدەبووینە نیشتەجێی دۆزەخ.





﴿ فَٱعۡتَرَفُواْ بِذَنۢبِهِمۡ فَسُحۡقٗا لِّأَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ١١ ﴾

ئەوسا ئیتر بەناچاریی و خەجاڵەتییەوە دان بەگوناه و تاوانی خۆیاندا دەنێن، جا با نیشتەجێکانی دۆزەخ لەو لا ترچن.



﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ ١٢﴾

بەڕاستی ئەوانەی کە لە پەروەردگاریان دەترسن ل پەنهانیدا، بۆ ئەوانە لێخۆشبوون و پاداشتی گەورە ئامادەیە.

﴿ وَأَسِرُّواْ قَوْلَكُمْ أَوِ ٱجْهَرُواْ بِهِۦٓۖ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ١١
ٱلصُّدُورِ ﴿١٣﴾ ﴾

خەڵکینە؛ چونیەکە بۆتان چ بەنهێنی قسە بکەن یان بەئاشکرا، ئەو زاتە بەهەموو ئەو خەتەرە و خەیاڵانەی دێن بەکرۆکی سینەکاندا زانا و ئاگایە.



﴿ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٤﴾ ﴾

مەگەر خوا نازانێت کێی دروست کردووە و چۆنی دروست کردووە، لەکاتێکدا ئەو زاتە وردکار و بە سۆز و ئاگایە.



١٢ ﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِى
مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ ﴿١٥﴾ ﴾

هەر ئەو زاتە زەوی بۆ زەلیل و ملکەچ کردوون (هەرچیتان بوێت لەسەری دروست دەکەن، چۆنتان بوێت بەکاری دەهێنن)، بگەڕێن بە هەموو گۆشە و کەناریدا، لەو ڕزق و ڕۆزیەش بخۆن کە پێشکەشتانی دەکات، دڵنیاش بن کە سەرئەنجام گەڕانەوەتان بۆ لای ئەو زاتەیە.



﴿ ءَأَمِنتُم مَّن فِى ٱلسَّمَآءِ أَن يَخْسِفَ بِكُمُ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا هِىَ تَمُورُ
﴿١٦﴾ ﴾

ئایا لەو زاتە ناترسن کە لە سەرووی ئاسمانەوەیە، کە بەناخی زەویدا بتانباتە خوارەوە؟!جا دەستبەجێ ئەو زەوی دەبێتە لەرزە.

﴿أَمۡ أَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبٗاۖ فَسَتَعۡلَمُونَ كَيۡفَ نَذِيرِ ﴿١٧﴾﴾



یاخود لەو زاتە ناترسن کە لە سەروو ئاسماندایە کە بایەکی بەهێز هەڵکاتە سەرتان و بەرد بارانتان بکات؟! ئەوسا دەزانن هەڕەشەی من چۆن بووە.

﴿وَلَقَدۡ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿١٨﴾﴾

سوێند بەخوا بێگومان خەڵکانی تری پێش ئەوان بڕوایان بەپێغەمبەرانی ئێمە نەکرد ئاشکرایە چ بەڵایەکم بەسەرهێناون و چۆن تەمبێم کردن.





١٤ ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى ٱلطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَٰٓفَّٰتٍ وَيَقْبِضْنَ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا ٱلرَّحْمَٰنُ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍۭ بَصِيرٌ ﴿١٩﴾﴾

ئایا سەرنجی باڵندەیان نەداوە بەسەریانەوە پۆل پۆل دەفڕن و باڵەکانیان لێک دەنێن، ئەو باڵندانە جگە لە خوای میهرەبان کەس بە ئاسمانەوە ڕاگیریان ناکات، بەڕاستی ئەو زاتە بە هەموو شتێک بینایە و هیچی لێ ون نابێت و چاودێری هەموو دروستکراوانی دەکات (فڕۆکە و کەشتی ئاسمانی و.... هتد، هەر ئەو زاتە بە هۆکارەکان لە ئاسماندا هاتووچۆیان پێدەکات و ڕایان دەگرێت).



﴿أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى هُوَ جُندٌ لَّكُمْ يَنصُرُكُم مِّن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ إِنِ ٱلْكَٰفِرُونَ إِلَّا فِى غُرُورٍ ﴿٢٠﴾﴾

ئایا کێیە ئەو کەسە خۆی بە سەرباز و بەرگریکەر لە ئێوە دەزانێت و وا دەنوێنێت کە دەتوانێت بەبێ خوای میهرەبان سەرتان بخات و پایەدارتان بکات؟! نەخێر، کافران تەنیا لە خەڵەتاویدان و هیچی تر؟!



﴿ أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى يَرْزُقُكُمْ إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُۥ ۚ بَل لَّجُّوا۟ فِى عُتُوٍّ وَنُفُورٍ ﴿٢١﴾ ﴾

یاخود کێیە ئەوەی کە ڕزق و ڕۆزیتان پێدەبەخشێت، ئەگەرخوا لێتان بگرێتەوە؟! نەخێر، بەو تاقی کردنەوەیەش بێ باوەڕان هەر لە گومڕایی و سەرلێشێواوی و دوورە پەرێزی لە بەرنامەی خوا ڕۆچوون!

﴿ أَفَمَن يَمْشِى مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِۦٓ أَهْدَىٰٓ أَمَّن يَمْشِى سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢٢﴾ ﴾

جا ئایا ئەو کەسەی کە دەمەو ڕوو کەوتووەو بەو حاڵەوە دەڕوات، چاکتر ڕێگە دەزانێت؟ یان ئەو کەسەی کە بەسەر شەقامێکی ڕاست و ڕەواندا بە ڕێک و پێکی دەڕوات بەڕێوە؟!



﴿ قُلۡ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُمۡ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَۖ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾

ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: هەر خوایە، کە ئێوەی دروستکردووە و دەزگای بینین و بیستن و تێگەیشتنی پێ بەخشیون، کەچی کەمتان شوکرانە بژێر و سوپاسگوزارن.



﴿ قُلۡ هُوَ ٱلَّذِي ذَرَأَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَإِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾

هەروەها پێیان بڵێ: هەر ئەو خوایە؛ ئێوەی لە خاکی زەوی پێگەیاندووە، گەڕانەوە و کۆکردنەوەشتان بۆ لای ئەوە.



﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ ﴾

بێ باوەڕان دەڵێن: باشە، کەی ئەم بەڵێنە دێتە دی، (زیندووکردنەوە و لێپرسینەوە) ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن؟!.



﴿ قُلْ إِنَّمَا ٱلْعِلْمُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢٦﴾ ﴾

پێیان بڵێ: زانیاری ئەو کاتە لای خوایە، من تەنیا بێدار کەرەوەیەکی ئاشکرام.





﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ زُلْفَةً سِيٓـَٔتْ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَقِيلَ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تَدَّعُونَ ﴿٢٧﴾﴾

کاتێک بینیان ئەو بەڵێنە خواییە یەخەیان پێ دەگرێت، چرچاوی ئەوانەی کە باوەڕیان نەبووە، تاڵ و ترش و ناشرین دەکرێت، ئەوسا پێیان دەوترێت ئا ئەمە ئەو بەڵێنەیە کەپێتان دەدرا.

﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَهْلَكَنِىَ ٱللَّهُ وَمَن مَّعِىَ أَوْ رَحِمَنَا فَمَن يُجِيرُ ٱلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٨﴾﴾

هەروەها پێیان بڵێ: باشە، ئەگەر خوا، من و هەموو ئەو کەسانەی کە شوێنم کەوتوون لەناو بەرێت، یان بەزەیی پیاماندا بێتەوە، ئەوسا کێ هەیە بێ باوەڕان لە سزای پڕ ئێشی دۆزەخ ڕزگار بکات؟! (ئەگەر لەسەر یاخی بوونیان بەردەوام بن)



۱۹

﴿ قُلۡ هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ءَامَنَّا بِهِۦ وَعَلَيۡهِ تَوَكَّلۡنَاۖ فَسَتَعۡلَمُونَ مَنۡ هُوَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ۝٢٩ ﴾

هەروەها بڵێ: ئێمە خوای میهرەبانمان هەیە و باوەڕی پتەومان پێیەتی و پشت و پەنامان هەر ئەوە، جا ئیتر ڕۆژێک دێت کە بە ڕوونی بۆتان دەردەکەوێت کێ لە گومڕایی ئاشکرادا گیری خواردووە و سەری لێ شێواوە.




﴿ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِنۡ أَصۡبَحَ مَآؤُكُمۡ غَوۡرٗا فَمَن يَأۡتِيكُم بِمَآءٖ مَّعِينِۭ ۝٣٠ ﴾

پێیان بڵێ: هەواڵم بدەنێ باشە ئەگەر ئاوەکەتان ڕۆچوو، کێ دەتوانێت ئاوی سازگار و ڕەوانتان بۆ بەدەست بهێنێت؟! (جگە لە خوای میهرەبان).



**لە کۆتایدا**

دوای سوپاس کردنی خوای گەورە، سوپاسی دانە بە دانەی ئەندامە بەڕێزەکانی ڕۆشنایی قوڕئان دەکەین، سوپاسی ئەو بەڕێزانە دەکەین کە هاوکاریان کردووین بۆ بەجێگەیاندنی ئەم پڕۆژەیە. لەم پڕۆژەیەدا بۆ ڕاڤەی سووڕەتی (الملك) تەفسیری ئاسانمان بەکار هێناوە، بۆ ئاسنکاری تێگەیشتن و لەبەرکردنی.

دووبارە دەڵێین؛ پەڕتووکی خودا بەرز و بێ کەموکوڕییە، بەڵام هەر کەموکوڕییەک هەبێت لە دیزاین و شێوازی پەڕتووکەکەدا لێمان ببورن و گەردنمان ئازا بکەن، هیچ کەسێک کامل نییە، تەنیا خوای گەورە نەبێت کامڵ و بێ عەیب و کار جوانە.

لە نزای خێر بێبەشمان مەکەن

دەستەی بەڕێوەبەری ڕۆشنایی قورئان